# قودسی پیرۆز
# شاری ئیسراو میعراج

## کورتە باسێکی مێژوویی و
## پێگەی قودس لە لای موسڵمانان

ئامادەکردنی:
م. مصطفى محمد جعفر (گوڵپی)

١٤٣٩ک -٢٠١٧ز

# پێناسەیەکی کورت دەربارەی شاری قودس

دادگـای دادی باڵـای ئیسـرائیلی لـه ٧ \ ٤ \ ١٤١٤ ك بەرامبـەر ٢٣ \ ٩ \ ١٩٩٣ ز بریـارێکی دەرکـرد و تێیـدا مزگـەوتی ئەقصـای پـیرۆزی بەزەویـەکی ئیسـرائیلی ئیعتبار کرد و لـەژێر سەرپەرشـتیارێتی رێکخراوی (أمنـا جبـل الهیکـل) ی زایـۆنی دانـا . ئەمـە بەهـەنگاوێك دێـت لەســەر رێ ی رووخانــدنی مزگــەوتی ئەقصــاو هەڵساندنەوەی هەیکەلی سولەیماندا.

ئـەم بریـارە هـیچ یاسـایەکی نێودەوڵـەتی یـاخود مـافێکی شـەرعی یـاخود سـەنەدێکی ئـەخلاقی پاڵپشـتی ناکات .

مێـژوو بۆمـان دەگێرێتـەوە کـە کەنعانیـەکان چـۆن قــودس و شــارەکانی دیکــەی فەلەســتینیان دروســت کردووە بەرلەوەی تاکە کەسێك لە جوو (یهود) چوبێتە ناویـەوە.بیرمـان نەچـێت کەنعانیـەکان نەتەوەیـەك بـوون

زمانيان هاوشێوەی زمانی عەرەبی بووە یاخودعەرەبی بوە .

ئەرزی کەنعان کۆنترین ناوێکە زەوی فەلەستینی پێ ناسراوە لە مێژوودا پێش لە هاتنی عیبرانییەکان، واتە: پێش لەهاتنی (یهود) بەسەدان ساڵ . وە دەگوترێ: یەبووسییەکان شاری قودسیان درووستکردووە، کەنعانیەکانیش شارەکانی دیکەی فەلەستینیان دروست کردوە.

شوێنی جوگرافی قودس: شاری قودس ئەکەوێتە ناودڵی فەلەستینەوەو بەسەر تەپۆڵکە گەلێکەوە یە بەرزاییەکەیان لەنێوان ٧٢٠ مەتر بۆ ٨٣٠ مەتر ئەبێت لەسەر رووی دەریاوە، وە لەسەر هێڵی درێژی (٣٥) ە لە رۆژ هەڵاتەوە، وە لەسەر هێڵی (٣٤)ە لەباکورەوە . وادی قدرون لە روژهەڵاتەوە سنووری شارە کە دیاری دە کات، ئەویش نێوان دیواری روژهەڵاتی شارە کە و نێوان کێوی زە یتوون (کێوی گو ر) لێك جیادە کاتەوە،

**لەرۆژئاواشـەوە (وادی سـلوان) و لـە باکوریشـەوە (جبـل المشـارف) و لەباشوریشـەوە (جبـل المکـبر) ئـەو کێـوەی ئیمامی عومەر خوای لێـی رازی بێـت لـەکاتی چوونە نـاو قودسەوە لە سەری وە ستا بوو.**

**شـــاری قـــودس دە بێـــت بـــە دوو بەشـــەوە:**

**١- بەشـــی کـــۆن: شـــارە مێژوییەکەیـــە کـــە گۆرەپـــانی مزگەوتی ئە قصای پیرۆز لە خۆ دە گرێت، رووبەرە کەی کیلـۆ مـەترێکی چـوار گۆشـەیە، دیوارەکەشـی لەهـەموو لایەکـەوە چـواردەوری گرتـووە، درێژیەکەشـی نزیکـەی چوار کیلۆمەتر و بەرزیەکەشی ١٢ مەتر ئەبێت.**

**ژمارەیـەك دەرگاشـی هەیـە، لەوانـە: (بـاب الاسـباط) و (بـاب حطـة) و(بـاب العـتم) و (بـاب الغوانمـة) و(بـاب النـاظر) و(باب الحديـد) و(باب الـذهبي) و(بـاب الجنـائز) و(بـــاب داود) و(بـــاب السلســـله) و(بـــاب الســـکینە) و چەندینی دیکە . وە چوار (مـاذن) و شـوێنی بـانگ بێـژی هەیە بەم ناوانەی خوارەوە:**

(مئذنة باب المغاربة) و(مئذنة باب السلسلة) و(مئذنة باب الغوانمة) و(مئذنة باب الاسباط) .

بەشی تازە: ئەم بەشە دابەش بوو بوو بۆ دوو ناوچە بەر لە داگیر کاری یەهودی لەسالی ١٣٨٧ك بەرامبەر ١٩٦٧ز، ئەوانیش ناوچەی رۆژهەڵاتی و ناوچەی رۆژئاوایی، بەڵام لەئێستادا شارە کە کامل بەمزگەوتی ئەقصاشەوە لەژێر داگیر کاری یەهودی ئیسرائیلیدایە.

## قودس لەبیرەوەری مێژوودا

٣٠٠٠ ساڵ پێش زاین کەنعانیەکان یاخوود یەبوسییەکان قودسیان دروست کردووە.

١٨٥٠ ساڵ پ .زپێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام گەیشتە قودس و پاشای کەنعانی یەکخواپەرست (مولکی صادق) پێشوازی لێکرد.

٩٧٠-٩٣١ پ.ز لەژێر حوکمی نەبی سولەیماندا بووە علیه السلام.

٧٢١پ.ز سەرجوونی دووەمی ئاشوری قەزای کرد بەسەر مەملەکەتی ئیسرائیلدا، هەرلەهەمان ساڵیشدا ئاشوریەکان هەڵسان بەراگواستنی دانیشتوانی مەملەکەتی ئیسرائیل بۆ حەران و خابور و کوردستان و فارس و کۆمەڵگەلێکیشیان لەئارامییەکان لەجێگەیان نیشتەجیٚ کرد.

٥٨٧ پ.ز نبو خڑ نصر پاشای بابل شاری قودسی پیروزی وێران کرد و (المعبد) یاخود (الهیکل) یشی تێکدا و هەرچی سەروەت و سامان و خەزێنەو گەنجینە بوو بەتاڵانی برد و(٤٠) هەزار لەیەهودی سەبی کرد بۆ بابل، ئەوانەشیان مانەوە کۆچیان کرد بۆمصر.

١٣٥ز ئیمپراتۆری رومانی (هدریان) لەقودس جووەکانی دەرکرد.

٤٠٠ ز _٦٣١ ز قودس لەژێر حوکمرانی بێزەنتێکاندا بوو.

**١٧ ك \ ٦٣٨ ز خەليفــەی راشــيد عومــەری كــوری خەتتاب قودسی فەتح كرد.**

**٤٩٢ك – ٥٨٣ك خاچپەرســـتان داگيريـــان كـــرد.**

**٥٨٣ك \ ١١٨٧ ز صــلاح الــدين الايــوبی لەژێردەســتی خاچپەرستان رزگاری كرد، واتە دوای ٩١ ساڵ لەداگير كردن.**

**٩٢٣ك– ١٣٦٦ك \ ١٥١٧ ز –١٩١٧ ز لـەژێر حـوكمی خيلافەتی عيمانيدا بوو.**

**١٣٣٦ك \ ١٩١٧ ز لەژێرداگيركاری بەريتانی دابوو.**

**١٣٦٩ك – ١٣٨٧ك \ ١٩٤٩ ز – ١٩٦٧ ز لـــــەنێوان ئوردون و داگير كاری (يەهودی) دا بۆ قودسی شەرقی و غەربی دابەشكرا.**

**١٣٨٧ك \ ١٩٦٧ ز يـــەهود بەتـــەواوی قودســـی كونترۆڵ كرد.**

١٤٠١ك \ ١٩٨٠ ز حوكمـەتی جـوو بەفـەرمی شـاری قودســی بــە پایتــەختی یــەکگرتووی دەوڵەتەکــەیان ناساند.

وەبریـاری دادگـای باڵـای ئیسرائیلیشـمان سـەبارەت بەمزگــەوتی ئەقصــای پــیرۆز لەســاڵی ١٤١٤ك \ ١٩٩٣ز باس کرد.

فــەتحی قــودس لەســـەردەمی خیلافــەتی عومـــەردا موسـولْمانەکان لەسـەردەمی خەلیفـەی یەکـەم صـدیقی ئەکبـەردا ئەسپەکانیان بـەرەو شـام تـاودا، بـەڵام ویسـتی خـوا وابـوو کەشـاری قـودس لەسەردەسـتی خەلیفـەی دووەم فاروقی ئیسلام عومەری کوری خـەتتاب لـە ساڵی ١٧ك فەتح بکریْ. عومـەر خـوا لیْـی رازی بیْـت بـە خـۆی بەسواری حوشتریْکی سوور دوای گـەمارۆ دانـی شارەکە لەلایــەن موسـڵمانەکانەوە، چـوو بـۆ شـاری قـودس بـۆ وەرگرتنی کلیلەکانی شارەکە لە بە تریک (صـفراینوس)، وە کۆمـەڵیْك لـەهاوە ڵـانی پیْغەمبـەری خـوا ﷺ یـاوەری

بوون لەوسەفەرەدا، لەناویاندا زوبەیری کوری عەوام و عوبادەی کوری صامت .وەلەکاتی رێکردنیاندا بەسەرە لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا سواری حوشترەکە دەبوون، وەکاتێك گەیشتنە نزیکی شاری قودس سەرەی خزمەتکارەکەی بوو سوار بێت، بۆیە خەلیفەدابەزی و خزمەتکارەکەسواربوو، جاکاتێك گاورەکان بینیان خەلیفە رەشمەی حوشترەکە رادەکێشێت وغوڵامەکەی بەسەر پشتی حوشترەکەوەیە بەگەورەیان زانی و بە تریکەکە (صفرانیوس) دەستی بەگریان کرد و وتی (ان دولتكم باقيه على الدهر فدوله الظلم ساعه ودوله العدل الى قيام الساعه) واتە: بێگومان دەوڵەتەکەی ئێوە زەمانێکی زۆر دەمێنێتەوە، جادەوڵەتی ستەمکاری ساتێك (واتە ماوەیەکی کەم) دەخایەنێت و دەوڵەتی دادپەروەری (عدل) هەتا روژی قیامەت دەخایەنێت، کاتێك عومەر کلیلەکانی شارەکەی لێوەرگرت، ئەمانی بۆ خەڵکی شارەکە نوسی، ئەویش بەعوهدەی عومەری

مەشـهورە، بێگومـان لـەو ئەماننامەیـەدا دڵنیـای کـردن لەســەر و مــاڵ و کەنیســەکانیان و ...هتــد، وەمــەرجێك لەمەرجەکانی خەلکی شارەکە لەئەماننامەکەدا ئەوە بوو کـــەجووەکان لەشـــاری قـــودس نیشـــتەجێ نـــەبن .

شــارەکە لــەژێر ریعایــەت و چــاودێری موســوڵماناندا مایـەوە هـەتاداگیر کردنـی لەلایـەن خـاچ دروشمەکانـەوە، پاشـان صـلاح الـدین ی ئـەیوبی لەژێردەسـتیان ئـازادی کــرد، هــەتا جووەکــان لەســاڵی ١٣٦٨ك – ١٩٤٨ز بەشـێکی شـارەکەیان داگـیر کـرد، پاشـان ئـەوەی مـابوو لەسـاڵی ١٣٨٧ك – ١٩٦٧ز داگیریـان کـرد، وەلـەو سـاوە هەتائێستا لەژێر داگیرکاری ئیسرائیلیدایەو چاوەروانی ئازاد کردنی دەکات لەلایەن موسوڵمانانەوە.

## ( دەقی عوهدەی عومەری )

بسم الله الرحمن الرحيم

هـذا مـا أعطى عبـدالله أمـير المـؤمنين عمـربن الخطـاب أهـل ايليـاء (القـدس) مـن ألأمـان أعطـاهم أمانـا لأنفسـهم وأموالهم ولكنائسهم وصلبانهم، وسقيمها وبريئها وسـائر ملتهـا أنـه لاتسـكن كنائسـهم، ولاتهـدم ولايـنـتقص منهـا، ولامـن حيزهـا، ولامـن صـلبهم ولا مـن شـيء مـن أمـوالهم، ولايكرهـون علـى ديـنهم، ولايضـار أحـد مـنهم ولايسـكن بايلياء معهم أحد من اليهود، وعلـى أهـل ايليـاء أن يعطـوا الجزية كما يعطي أهل المـدائن، وعليهم أن يخرجـوا منهـا الـروم واللصـوص، فمـن خـرج مـنهم فهـو أمـن علـى نفسـه وماله حتى يبلغوا مأمنهم ومن أقام منهم فهـو أمـن وعليـه مثـل مـاعلى أهـل ايليـاء مـن الجزيـة، ومـن شـاء سـار مـع الروم، ومن شاء رجع الى أهلـه لايؤخـذ مـنهم شـيء حتـى يحصدوا حصادهم وعلى مافي هذا الكتـاب عهـد الله وعهـد

رسـوله وذمـة الخلفـاء وذمـة المـؤمنين اذا أعطـوا ألـذي عليهم من الجزية.

شهد على ذلك:

خالد بن الوليد، وعمرو بن العاص، وعبدالرحمن بن عوف، ومعاويةبن أبي سفيان

## پێگەی قودس لەلای موسڵمانان

١- قودس پێگەیـەكی گـەورەی هەیـە لـەدڵ و دەرونـی موسـڵمانانـدا، سـێیەم شـاری پـیرۆزە لـەدوای مەككـەو مەدینە، وەلەگەڵ ئەوەشدا مەسرای پێغەمبەری خوابووە ﷺ، وە لەوێشـــەوە بـــەرز كراوەتـــەوە بۆئاسمانـــەكان، خوای باڵا فەرمویـەتی: (سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ) (الاسراء: ١).

٢-مزگەوتی ئەقصای پیروزی لـەئامێز گرتـووە، یـانی ئەو مزگەوتەی سەفەر بۆكردنی لەگـەڵ دوومزگەوتەكـەی دیكـە (مسـجد الحـرام) و(مسـجد النبـوی) رپێـدراوە.

**ئـەبوهورەیرە لەپێغەمبـەرەوە ﷺ ئەگێڕیتـەوە و ئـەلێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (... لاتشد الرحال الا الى ثلاثـة مسـاجد، مسـجدالحرام، ومسـجدي، ومسـجد ألاقصى) متفق عليه .**

**٣- نوێژکردن تێیدا بە پێنج سەد نویـژە، ئـەبو دەرداء ئەگێڕێتەوەو ئەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:**

**(الصـلاة في المسـجد الحـرام بمائـة ألـف صـلاة، والصـلاة في مسـجدي بـألف صـلاة، والصـلاة في بيـت المقدس بخمسمائة صلاة) حديث حسن رواه الطبراني في الكبير.**

**٤-قودس هەمان ئەوشارەیە کە لەفەرمودەدا ناسـراوە بە (بيت المقدس) و موسڵمانەکان شانزە یاخود حەڤدە مـانگ دوای کـۆچ لەنوێـژدا روویـان تێکـرد.عـن الـبراءبـن عازب قال: (صلى رسول الله ﷺ قبل بيت المقدس ستة عشر أو سبعة عشر شهرا) رواه البخاري.**

**٥-مۆڵگـەی ئـەو کۆمـەڵ وتائیفەیەیـە پابەنـدن بەحەقەوە. ئـەبو ئومامـە وتویـەتی: پێغەمبـەری خـوا ﷺ**

فەرموی: (لاتزال طائفة من أمتي على الدين ظاهرين، لعدوهم قاهرين، لايضرهم من خالفهم، الا ما أصابهم من لأواء حتى يأتيهم أمر الله وهم كذلك)، قالوا: يارسول الله وأين هم؟ قال: (ببيت المقدس وأكناف بيت المقدس) رواة أحمد .

٦- زەوی و خاكێكی پیرۆز و پاكە بەدەقی قورئان، خوای باڵا لەسەر زمانی (موسى) پێغەمبەر عليه السلام فەرمویەتی:

(يَا قَوْمِ ادْخُلُوا الْأَرْضَ الْمُقَدَّسَةَ الَّتِي كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ...) (المائدة:٢١)، وةفةرمويةتي: (وَنَجَّيْنَاهُ وَلُوطًا إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا لِلْعَالَمِينَ) (الأنبياء:٧١).

٧-زێدی پێغەمبەران وشوێنی دابەزینی وەحی بوە بۆیان، تێیاندا ابراهيم و لوط و اسحاق و يعقوب و داود و سليمان وعيسى، عليهم السلام.

ململانێ لەگەڵ جوو بەردەوام دەبێت تا هاتنی عیسى عليه السلام:

خوێنـەری بـەرێز، جولەکـە دەمێکـە چـاوی بریوەتـە قودسـی پـیرۆز، دیڤیـد غوریـون دامەزرێنـەری دەوڵـەتی زایۆنی وتویەتی:

(ئیســرائیل هــیچ نرخێکــی نیــە بــەبێ قــودس، قودســیش هــیچ نرخێکــی نیــە بــە بــێ هەیکــەل) . ململانێ لەگـەڵ جوو هـەتا نزیـك بونـەوەی رۆژی قیامـەت بــەردەوام ئــەبێت، سەنتەرەکەشــی شــاری قــودس و مزگـەوتی ئەقصـایە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرمویـەتی: (لاتقـوم السـاعة حتـى يقاتـل المسـلمون اليهـود، فيقتلـهم المســلمون، حتــى يختبــأ اليهــودي مــن وراء الحجــر والشجر، فيقول الحجر أو الشجر: يامسلم، يا عبدالله هـذا يهـودي خلفـي فتعـال فاقتلـه، الا الغرقـد فانـه مـن شـجر اليهـود) رواه مسـلم والبخـاري، وهـذا لفـظ مسـلم. بـەڵێنی خـوا راستەو دێتەجێ:

ئێمە یەقینمان بە بەڵێنی خوا هەیە کەبەڵێنی بەبەنـدە گەلەچـاکەکانی ئــەم ئوممەتــە داوە کــە زەوی پــیرۆز و

هەموو سەر ئەرز بخاتە ژێر ركێف و دەسەڵاتیانەوە، خوا ئەفەرموێ: (وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ) (الانبياء:١٠٥-١٠٦) .

ئەمە كورتەباسێك بوو لەمێژووی قودسی پیرۆز و پێگەو مەكانەتی لەدڵ ودەروونی موسڵماناندا .

سەرچاوەكان:


١-قورئانی پیرۆز.

٢-صحيح البخاري.

٣-صحيح مسلم.

٤- بيت المقدس مدينة الاسراء والمعراج، الجمعية الخيرية الاسلامية لنصرة الأقصى الشريف .

٥-المسجد الأقصى الذي لانعرفه، عصام عبدالرزاق .


چوارشەمە ٢٥ ربيع الاول ١٤٣٩ك -١٣ \ ١٢ \ ٢٠١٧ ز